چیرۆکی پێغەمبەران

# چیرۆکی حەزرەتی هود و حەزرەتی صالح

## (سڵاوی خوایان لێبێت)

3

نووسەر : کەمال سەید

وەرگێڕانی : ئازاد عەبباس گڵێجاڵی

وێنە : حەسەنێین و تەیبە عەبدوڵڵا

ناوی کتێب: چیرۆکی حەزرەتی هود و حەزرەتی صاڵح(سڵاوی خوایان لێبێت)
ناوی نووسەر: کەمال سەید
وەرگێڕانی: ئازاد عەبباس گڵێجاڵی
وێنە: حەسەنێین و تەیبە عەبدوڵڵا
نۆبەتی چاپ: دووەم/2022
چاپ: ناوەندی ڕێنوێن
تیراژ: 1000 دانە
ژپنک (ISBN): 9-65-626-9922-978
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (1329)ـی ساڵی (2018)ـی پێ دراوە.



**ناوەندی ڕێنوێن**
07701932749 - 07501269689
hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com
سلێمانی - بازاڕی ئاوباریک - نهۆمی یەکەم
بەرامبەر کاسۆمۆڵ - دوکانی ژمارە (٦٦)

# چیرۆکی حەزرەتی هود و حەزرەتی صالح

## (سڵاوی خوایان لێبێت)

نووسەر : کەمال سەید

وەرگێڕانی: ئازاد عەبباس گلێجاڵی

وێنە: حەسەنێین و تەییە عەبدوڵلا

## حەزرەتی هود(سڵاوی خوای لێبێت)

ئەگەر تەماشایەکی نەخشەی نیمچەدوورگەی عەرەبی بکەی، لە لای خۆرهەڵاتەوە سارایەکی کاکی بە کاکی و بەر فراوان دەبینرێ... پێی دەوترێ (الربع الخالی) واتە: چارەکی چۆڵ.

بۆیە پێی دەگوترێ چارەکی چۆڵ، چونکە چۆڵە لە ژیان و ئاو و گژوگیا..

پێش هەزاران ساڵ ئەو شوێنە شوێنێکی سەوز و پڕ لە کانی و ئاو بوو.. زانایانی شوێنەوارناس پاشماوەی شارێکیان لە ژێر لمی ئەو بیابانە دۆزیوەتەوە..

لەو شوێنە هۆزەکانی (عاد) دەژیان.. هۆزەکانی عاد چەند هۆزێکی زۆر بەهێزی عەرەبی کۆن بوون.. مێژوو بە هیچ شێوەیەک باسی ئەو گەلانەی نەکردووە.. تاکە باسێک مابێتەوە ئەوەیە کە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزا باسی کردووە..

باران لە وەرزی خۆیدا دەباری.. سەرزەوی تەواو سەوز و خۆش دەبوو.. کانییەکان دەتەقین.. شیو و دۆڵەکان پڕ دەبوون لە ئاو.. باخەکانیش تەواو گەش و جوان و پڕ لە داری سەوز و بەردار دەبوون..

لەو سەردەمەدا خەڵکی زۆر گرنگییان بە شێوازی بیناسازی و ئاوەدانی و کۆشک و تەلار و قەڵا و شوورای گەورە گەورە دەدا..

گەلانی عاد زۆر زۆر بەهێز بوون.. ئەوان شانازییان بە هێز و بازووی خۆیانەوە دەکرد.. تا وای لێهات لە خۆبایی بوون.. دەستیان کرد بە بتپەرەستی و هاوەڵدانان بۆ خوای تاقانە.. بەهێزترینەکان بوونە ستەمکار.. هەژار و لاوازەکانیان دەچەوساندەوە و ستەمیان لێ دەکردن و دەیانکردن بە کۆیلە و بازرگانییان پێوە دەکردن.. ئەو کەسانەش کە لە سەر ئایینی پاک و یەکتاپەرەستی مانەوە، هیچ دەسەڵاتێکیان نەبوو.. کەس قسەی لێ وەرنەدەگرتن..

لەو سەردەمەدا و لەو سەرزەوییەدا پێغەمبەر هود(سڵاوی خوای لێبێت) دەژیا..

حەزرەتی هود پیاوێکی زۆر خواناس بوو.. زۆر زۆر چاکەکار بوو.. کاری چاکەی خۆش دەویست.. بەو بۆنەوە خوای گەورە هەڵیبژارد و کردی بە پێغەمبەری خۆی.. کاری بانگەوازی گەلی عادی پێ سپارد..

حەزرەتی هود(سڵاوی خوای لێبێت) پێغەمبەرایەتی خۆی لە ناو گەلی عاددا ڕاگەیاند.. خەڵکی بانگ دەکرد بۆ یەکتاپەرەستی و دوورکەوتنەوە لە بتپەرەستی..

حەزرەتی هود(سڵاوی خوای لێبێت) پیاوێکی زۆر دلێر و بوێر و چاونەترس بوو.. لە خوا نەبێ لە هیچ کەس و شتێک نەدەترسا.. چونکە دەیزانی خوای گەورە لە هەموو کەس و لە هەموو شتێک بەهێزترە.. هەر ئەو خاوەن دەسەڵاتی ڕەهایە..

ئەو کەسانەی ناخیان پاک و خاوێن بوو، بڕوایان بە حەزرەتی هود(سڵاوی خوای لێبێت) هێنا.. بەڵام زۆر کەم بوون..

پیاوە دەوڵەمەند و دەسەڵاتدارەکان گاڵتەیان بە حەزرەتی هود(سڵاوی خوای لێبێت) و شوێنکەوتووانی دەکرد.. گاڵتەیان بە پەیامەکەی دەکرد.. ناووناتۆرەیان بۆ حەزرەتی هود(سڵاوی خوای لێبێت) هەڵدەبەست.. دەیانگوت: هود(سڵاوی خوای لێبێت) شێتە.. بێئاوەزە.. دێو دەستی لێ وەشاندووە!..

ئەوان پێیان وابوو ئەو بتە تاشراوانە ڕزق و ڕۆزی ئەوان دابین دەکەن!.. پێیان وابوو بە فەرمانی ئەو بتانە باران دەبارێ و زەوی سەوز و پڕ لە ئاو و کانی و خێر و خۆشی دەبێ.. بۆیە دەیانگوت: کوڕە هود(سڵاوی خوای لێبێت) شێتە!.. خوداکان نەفرەتیان لە هود(سڵاوی خوای لێبێت) کردووە!..

ئەوان دەهاتن و ئامۆژگاری حەزرەتی هود(سڵاوی خوای لێبێت)یان دەکرد و پێیان دەگوت: ئەگەر لەسەر ئەم قسانەی خۆت بەردەوام بیت، ئەوا کۆتاییت چاک نابێ.. خوداکان سزایەکی توندت دەدەن!..

## وشکەساڵی و بێبارانی

گەلی عاد بوون بە دوو دەستە و تاقمەوە.. بەشێکیان باوەڕیان بە خوای گەورە و پێغەمبەرایەتی حەزرەتی هود(سلاوی خوای لێبێت) هێنا.. بەڵام ئەوانە زۆر کەم بوون..

بەشی دووەمیان کافر بوون و سوور بوون لە سەر گومڕایی و بتپەرەستی.. ئەمانە گەلێک زۆر بوون!..

وەرزی باران هاتە پێشەوە.. بەڵام باران نەباری.. هەور دەهاتە ئاسمانی ئەو شوێنە و ماوەیەک دەمایەوە و هیچی نەدەباراند و دەڕۆیشت!..

ئەو ساڵە یەک دڵۆپە باران نەباری.. بەروبووم تەواو کەم بوو.. بڕێکی زۆر ئاژەڵ لە برسان و لە تینوان مردن.. کشتوکاڵ وشک بوون و هیچ بەرهەمێکیان نەبوو..

ئەو ساڵە تێپەڕی.. ساڵی نوێ هاتەوە.. دیسان هەور لە ئاسمان کۆ بوویەوە.. گەلی عاد زۆر دڵخۆش بوون..

چاوەڕێ بوون بارانێکی باش ببارێ.. هەورەکانی ئاسمان هەوری ڕەش و چڕوپڕ بوون..

خەڵکەکە لە ناو خۆیاندا بە یەکتریان دەگوت: ئەم هەورە بارانێکی زۆر و باشی پێیە!..

بەڵام زۆری نەبرد هەورەکان ڕەوینەوە.. باران نەباری.. ڕەشەبایەکی بەهێز هەڵیکرد و لمی بیابانی لە گەڵ خۆیدا دەهێنایە ناو شار.. ڕەشەبا و لمی بیابان، ژیانیان لە خەڵکەکە تاڵ کرد..

## باوەڕهێنان و خێروخۆشی

حەزرەتی هود(سلاوی خوای لێبێت) هات و دەستیکرد بە ئامۆژگاری گەلەکەی.. فەرمووی: ﴿وَ يا قَوْمِ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ يُرْسِلِ السَّماءَ عَلَيْكُمْ مِدْراراً وَ يَزِدْكُمْ قُوَّةً إِلى قُوَّتِكُمْ وَ لاتَتَوَلَّوْا مُجْرِمينَ﴾ هود: ٥٢ واتە: ئەی خزمەکانم داوای لێخۆشبوون لە پەروەردگارتان بکەن، پاشان بگەڕێنەوە بۆ لای ئەو، ئەوە لە ئاسمانەوە بارانی زۆری پر بەرەکەتتان بۆ دەبارێنێت، هێز و دەسەڵاتتان بۆ زیاد دەکات، زیاد لە هێز و دەسەڵاتی ئاسایی خۆتان، ڕوو وەرمەگێڕن لەم باس و ئامۆژگارییانە لەکاتێکدا هەمیشە تاوانبارن.

بەڵام خەڵکەکە بە گوێی حەزرەتی هود(سلاوی خوای لێبێت)یان نەکرد و لە وەڵامدا وتیان: ﴿يا هُودُ ما جِئْتَنا بِبَيِّنَةٍ وَ ما نَحْنُ بِتارِكي آلِهَتِنا عَنْ قَوْلِكَ وَ ما نَحْنُ لَكَ بِمُؤْمِنينَ * إِنْ نَقُولُ إِلاَّ اعْتَراكَ بَعْضُ آلِهَتِنا بِسُوءٍ﴾ هود: ٥٣-٥٤ واتە: ئەی هود! بەڵگەیەکی زۆر ڕۆشنت بۆ نەهێناوین تا بە تەواوی ئێمە قەناعەت بکەین (کە تۆ پێغەمبەری خوایت) و ئێمەش واز لە خواکانی خۆمان ناهێنین بە قسەی تۆ، ئێمە ئیمان و بڕوامان نییە بە ڕاستێتی تۆ... ئێمە تەنیا ئەوەت پێ دەڵێین: وا دیارە هەندێ لە خواکانمان بەخراپ دەستیان لێ وەشاندوویت!!.

حەزرەتی هود(سلاوی خوای لێبێت) فەرمووی: ﴿إِنِّي أُشْهِدُ اللّهَ وَ اشْهَدُوا أَنِّي بَرِيءٌ مِمّا تُشْرِكُونَ * مِنْ دُونِهِ فَكيدُوني جَميعاً ثُمَّ لاتُنْظِرُونِ * إِنِّي تَوَكَّلْتُ عَلَي اللّهِ رَبِّي وَ رَبِّكُمْ ما مِنْ دَابَّةٍ إِلاّ هُوَ آخِذٌ بِناصِيَتِها إِنَّ رَبِّي عَلى صِراطٍ مُسْتَقيمٍ * فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقَدْ أَبْلَغْتُكُمْ ما أُرْسِلْتُ بِهِ إِلَيْكُمْ وَ يَسْتَخْلِفُ رَبِّي قَوْماً غَيْرَكُمْ وَ لاتَضُرُّونَهُ شَيْئاً إِنَّ رَبِّي عَلى كُلِّ شَيْءٍ حَفيظٌ﴾ هود: ٥٤-٥٧ واتە: (هود وتی): دەی من بەڕاستی خوا دەکەم بە شایەد و ئێوەش بەشایەد بن کە بێگومان من بەریم لەوەی ئێوە دەیکەنە شەریك و هاوەڵ بۆ خوا...

جگە لە خوا خۆتان و پەرستراوەکانتان هەر هەمووتان فێڵ و پیلانم بۆ بگێڕن، کەوابوو وەرن هەمووتان کۆببنەوە و نەخشە بکێشن بۆ لەناوبردنم، پاشان مۆڵەتیشم مەدەن!... چونکە بەڕاستی من پشتم بە خوا بەستووە، کە پەروەردگاری من و پەروەردگاری ئێوەیشە، هیچ گیانلەبەرێك نییە جڵەوی بەدەست خوای گەورەوە نەبێت، بێگومان پەروەردگارم لەسەر بەرنامە و ڕێبازێکی ڕاست و درووستە... جا ئەگەر ئێوە گوێم بۆ نەگرن و پشت بکەنە ئەم بەرنامەیە، ئەوە بێگومان من ئەو بەرنامە و پەیامە خواییەی بە مندا نێردراوە بۆتان، پێم ڕاگەیاندن و پەروەردگارم (ئەگەر ملکەچ نەبن) ئێوە لەناو دەبات و هۆزێکی تر دەخاتە شوێنی ئێوە، ئێوە ناتوانن هیچ زیانێك بەو بگەیەنن، بەڕاستی پەروەردگاری من بەسەر هەموو شتێکدا چاودێر و بە توانایە.

ساڵی سێیەم هاتە پێشەوە.. ئەو ساڵەش ساڵێکی پڕ لە ئێش و ئازار و وشکەساڵی بوو.. ڕەشەبا و لمی بیابان نەبێ هیچی تریان نەدی.. برسێتی و قات و قڕی تەواو باڵی بەسەر ئەحقافدا کێشابوو..

دانیشتوانی ئەوێ دەهاتنە دەرەوە، سەیری گۆشە و کەناری ئاسمانیان دەکرد، بەو هیوایەی لە شوێنێکەوە پارچە هەورێک ببینن و کەمێک دڵیان خۆش بکات.. چاوەڕێی باران بوون..

حەزرەتی هود(سڵاوی خوای لێبێت) هات و بۆ جاری دوایەمین ئامۆژگاری کردن.. پێی فەرموون: کورە ئێوە بۆ بیر لە شاری (ئیرەم) ناکەنەوە؟.. خۆ هاووێنەی شاری ئیرەم لە هیچ شوێنێک بوونی نەبوو.. سەیرکەن بزانن چۆن باخ و کشتوکاڵی ئیرەم هەر هەمووی تیاچوو.. وشک هەڵگەڕا.. هەمووی بوو بە پووش و پووشەکەیش کۆتایی هات!.. بەڕاستی شەدداد ناتوانێت ئێوە ڕزگار بکات و هیچ سودێکیتان پێ ناگەیەنێت..

چەند کاتێکی پڕ لە ناخۆشی تێپەڕی.. گەلی عاد بۆ ئەوەی بارانیان بۆ بباریێ پەنایان دەبردە بەر بتەکان.. لە لای ئاسۆوە هەورێکی ڕەش دەرکەوت.. ئاسمانی داپۆشی..

## ڕەشەبای تورەیی

گەلی عاد دڵخۆش بوون و وایان گومان برد کە ئەو هەورە بارانێکی باشی پێیە..

حەزرەتی هود(سڵاوی خوای لێبێت) پێی ڕاگەیاندن و فەرمووی: ﴿بَلْ هُوَ مَا اسْتَعْجَلْتُمْ بِهِ رِيحٌ فِيهَا عَذابٌ أَلِيمٌ ۞ تُدَمِّرُ كُلَّ شَيْءٍ بِأَمْرِ رَبِّها﴾ الأحقاف: ٢٤—٢٥ واتە: نەخێر وانییە، بەڵکو ئەوە ئەو کارەساتەیە پەلەتانە پێش بێت، ڕەشەبایەکی توند، کە سزایەکی بەئازار و بەئێشی پێیە... ئەوە ڕەشەبایە، بە فەرمانی پەروەردگاری، هەموو شتێک و هەموو شوێنێک کاول دەکات.

حەزرەتی هود(سڵاوی خوای لێبێت) و ئەو کۆمەڵە کەمەی کە بڕوایان پێکردبوو، پەنایان بردە بەر کێوێک.. ڕەشەبایەکی توند و زۆر سارد دەستیپێکرد.. هەور لە هەموو لایەکی سەر ئەو شارە دەیبرووسکاند و لە هەموو شتێکی دەدا.. ئاگر بەربوویە هەموو شوێنێک.. ئەو بروسکانە دڵی هەموو کافرەکانی لەت کرد.. بتەکانی هەموو وردوخاش کرد.. یەک بت بە پێوە نەما..

ڕەشەباکە جگە لەوەی سارد بوو، لمی بیابانیشی لە گەڵ خۆی هەڵگرتبوو.. ئەو ڕەشەبا ڕوخێنەرە حەوت شەو و هەشت ڕۆژ بەردەوام بوو.. هەموو شیو و دۆڵەکانی ئەو ناوچەیە پڕ بوون لە لمی بیابان.. شارەکە بە تەواوی تیاچوو.. بوو بە ژێر لمەوە.. نە کۆشک و تەلار بەدەرەوە ما، نە باخ و کشتوکاڵ.. ئەو شارە گەورە خۆشە هەمووی بوو بە ژێر لمی بیابانەوە و بوو بە بیابان..

مرۆڤەکانی گەلی عاد هەموویان مرۆڤی زۆر باڵابەرز و چوارشانە بوون.. کاتێ ڕەشەبا لێیدەدان وەک داری وشکی خورما دەشکان.. بەو جۆرە نەفرەتی خوای گەورە هەموو کافر و بتپەرستەکانی ئەو شوێنەی گرتەوە..

خوای گەورە گەلی عادی لەناوبرد.. تەنیا حەزرەتی هود(سڵاوی خوای لێبێت) و شوێنەکەوتووانی ڕزگاریان بوو.. ئەوان سەرلەنوێ ژیانێکی پڕ لە خێر و خۆشی و خواپەرستییان دەست پێکردەوە..

## حەزرەتی صاڵح(سڵاوی خوای لێبێت)

لە (وادی القری) لە باکوری نیمچەدوورگەی عەرەبی، هۆزێک بە ناوی (هۆزی سەمود) دەژیا..
هۆزی سەمود خەریکی کشتوکاڵ بوون.. کێوەکانیان دەتاشی و لە ناو کێوەکاندا خانوویان بۆ خۆیان دروست دەکرد..
هۆزی سەمود خوایان نەدەناسی.. ئەوانیش وەکو گەلی عاد بتپەرەست بوون..
لە ناو ئەو هۆزەدا خوای گەورە کەسێکی بە ناوی صاڵح(سڵاوی خوای لێبێت) هەڵبژارد و کردی بە پێغەمبەری خۆی بۆ سەر ئەو گەل و هۆزە..
حەزرەتی صاڵح(سڵاوی خوای لێبێت) پێش ئەوەی ببێ بە پێغەمبەر، پیاوێکی زۆر دانا و ژیر بوو.. خەڵکەکە پێیان وابوو ئەگەر سەرکردەکەیان بمرێ، ئەوا حەزرەتی صاڵح(سڵاوی خوای لێبێت) دەبێتە جێگرەوەی و دەبێتە سەرۆک هۆز!..

## پەیامی ئاسمانی

خوای گەورە حەزرەتی صاڵح(سڵاوی خوای لێبێت)ی هەڵبژارد بۆ ئەوەی لە ڕێگەی ئەوەوە پەیامی خۆی بۆ هۆزی سەمود ڕەوانە بکات.. بەڵکو ئەو هۆزە ڕێگەی ڕاست بگرنەبەر و واز لە هاوەڵدانان و بتپەرەستی بهێنن!..

دەسەڵاتدارانی هۆزی سەمود حەزیان لە خێر و چاکە نەبوو.. ستەمکار و ملهوڕ بوون.. هەرکەسێ لە فەرمانی ئەوان دەرچووبا، بە توندترین شێوە ئازاریان دەدا و تۆڵەیان لێ دەسەندەوە!..
کاتێ حەزرەتی صاڵح(سڵاوی خوای لێبێت) بوو بە پێغەمبەر و بانگەشەکەی خۆی ڕاگەیاند، گەلی سەمود بوون بە دوو دەستەوە..
دەستەیەک بڕوایان بە خوای تاک و تەنیا و دەسەڵاتدار هێنا و شوێن حەزرەتی صاڵح(سڵاوی خوای لێبێت) کەوتن..
دەستەی دووەم باوەڕیان نەهێنا و زیاتر لە ڕێگەی ڕاست دوورکەوتنەوە..
کێشە کەوتە نێوان دەستەی خواناس و دەستەی لە خوا یاخی..

هۆزی سەمود بتپەرەست بوون.. حەزرەتی صاڵح(سڵاوی خوای لێبێت) پێی فەرموون: ﴿یا قَوْمِ اعْبُدُوا اللّهَ ما لَكُمْ مِنْ إِلهٍ غَيْرُهُ﴾ الأعراف: ٧٣ واتە: ئەی خزمانی من! ئێوە بەندایەتی بۆ خودا بکەن، جگە لە خوا ئێوە هیچ خودایەکتان نییە.

ئەی گەل و هۆز و خزمانی من!.. بەڕاستی تەنیا خوای گەورە ئێوەی دروست کردووە.. هەر ئەو خودایە منی کردووە بە پێغەمبەری خۆی.. بە منی ڕاگەیاندووە تا بە ئێوە بڵێم: تەنیا ئەو بپەرەستن و جگە لە ئەو هیچ شت و هیچ کەسێک بە خوا مەزانن.. هاوەڵی بۆ دامەنێن!..

هۆزی سەمود وتیان: هەتا لەو تاشە بەردە گەورەیە وشترێک نەهێنیتە دەرەوە ئێمە بڕوات پێ ناکەین!..

حەزرەتی صاڵح(سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی: مۆڵەتم بدەن با گفتوگۆ لە گەڵ خوای گەورەدا بکەم.. ئەو بەتوانایە و دەسەڵاتی هەموو کارێکی هەیە.. ئەگەر خوای گەورە داواکەی ئێوەی جێبەجێ کرد، بڕوای پێ دەکەن؟.. موسوڵمان دەبن؟..

هەمووان وتیان: بێگومان بڕوا دەکەین، بەڵام تۆ کاتەکەمان بۆ دیاری بکە!..

حەزرەتی صاڵح(سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی: سبەینێ هەر ئا لێرە..

## وشترەکەی خوای گەورە

لەکاتی هەڵاتنی خۆری بەیانییەکی نوێدا، حەزرەتی صاڵح(سڵاوی خوای لێبێت) ڕێگای گرتەبەر و ڕۆیشت بۆ لای کێوەکە و لای ئەو تاشە بەردە گەورەیە کە دەبوو وشتری لێ بێتە دەرەوە..

ئەو شتەی دەبوو ڕووبدات، شتێکی سادە نەبوو.. ئەوە موعجیزە و پەرجوویەکی زۆر گەورە بوو.. چۆن بەردێکی وشک و ڕەق و بێگیان لەت دەبێت و وشترێکی مێنگەی ئاوسی لێ دێتە دەرەوە؟!..

هۆزی سەمود هەموو لای بەردە گەورەکە کۆ بوونەوە.. هەموویان سەیری بەردەکەیان دەکرد.. چاودێری ڕووداوەکانیان دەکرد.. بینییان کە حەزرەتی صاڵح(سڵاوی خوای لێبێت) ڕووی لە ئاسمانە و نزا دەکات و لە خوای خۆی دەپاڕێتەوە.. دەیانبینی بە دەستەکانی تاوێک ئاماژە بۆ ئاسمان دەکات و تاوێک ئاماژە بۆ خەڵکەکە دەکات!..

حەزرەتی صاڵح(سڵاوی خوای لێبێت) لە جێگەی خۆی هەستا.. چاوەکانی سڕی.. داوای لە خوای گەورە کرد تا نیشانەی هەرە گەورە پیشانی خەڵکەکە بدات..

دوای ماوەیەکی تر حەزرەتی صاڵح(سڵاوی خوای لێبێت) هەستا و بە پەنجەی دەست ئاماژەی بۆ ناوەڕاستی بەردەکە کرد.. موعجیزە و پەرجوو ڕوویدا..

هەمووان دەنگێکی زۆر گەورەیان بیست.. دەنگی کەرت بوونی بەردێکی زل و گەورە.. لە هەموو لایەکەوە بەرد خلۆر دەبوویەوە.. تەپوتۆز ئەو ناوەی گرتەوە.. لە ناو بەردە گەورەکەدا وشترێکی زۆر جوانی دووگیان هاتە دەرەوە..

وشترەکە هێندە جوان بوو هەرکەس چاوی پێی کەوتبا خۆشی دەویست..

حەزرەتی صاڵح(سڵاوی خوای لێبێت) سەجدەی سوپاس گوزاری بۆ خوای گەورە برد..

ئەوە دەسەڵاتی خوای گەورەی پیشانی ئەو خەڵکەدا.. ئەو خوایەی کە بە هەر شتێ بفەرمووێ: ببە.. ئیتر دەبێ و دێتە دونیا..

خەڵکەکە سەریان سوڕما.. هەندێکیان وەک حەزرەتی صاڵح(سڵاوی خوای لێبێت) سەجدەی سوپاسگوزارییان بۆ خوای گەورە برد..

وشترەکە بیوە نیشانە بۆ ڕاستگۆیی حەزرەتی صاڵح(سڵاوی خوای لێبێت).. بوو بە دروشمێک بۆ گەورەیی و دەسەڵاتی خوای گەورە..

## گەلەکۆمە و پیلان

وشترەکە بێچوویەکی زۆر جوانی بوو.. خۆی و بێچووەکەی ببوون بە نیشانە و دەسەڵاتی خوای گەورە و ڕاستگۆیی حەزرەتی صاڵح(سڵاوی خوای لێبێت)..

کاتێک خەڵک چاویان بە وشترەکە دەکەوت، دەیانگوت: ئەوە وشترەکەی صاڵح(سڵاوی خوای لێبێت) پێغەمبەرە!..

حەزرەتی صاڵح(سڵاوی خوای لێبێت)یش دەیفەرموو: ئەوە وشتری خوای گەورەیە!..

وشترەکە وشترێکی زۆر بە فەڕ و پیت بوو.. ئەوەندە شیری هەبوو کە بەشی هەمووانی دەکرد..

هۆزی سەمود بوون بە دوو دەستەوە.. دەستەی موسوڵمان و باوەڕدار.. دەستەی بێباوەڕ و یاخی.. کێشە کەوتەوە نێوان ئەم دوو دەستەیە..

کافرەکان ڕقیان لە موسوڵمانەکان بوو.. زیاتر لە هەمووان ڕقیان لە حەزرەتی صاڵح(سڵاوی خوای لێبێت) بوو.. چونکە ببووە هەڕەشە بۆ سەر بەرژەوەندییە ناڕەواکانی ستەمکاران!..

ڕۆژێک نۆ پیاو لە کافرەکان کۆبوونەوە.. ئەوەندە خواردنیان خوار تا تەواو تێر بوون.. ئەوەندە مەی و عارەقیان خواردەوە تا تەواو سەرخۆش بوون.. زۆر بە ناخۆشی و ڕقێکی لە ڕادە بەدەر باسی حەزرەتی صاڵح(سڵاوی خوای لێبێت) و وشترەکەیان دەکرد..

یەکێک لەو نۆ کەسە وتی: دەبێ ئەو وشترە بکوژین!..

هەمووان لە سەر ئەنجامدانی تاوانێکی گەورە ڕێکەوتن.. یەکێک لەوانە ناوی (قەیدار) بوو.. قەیداری بەدبەخت شمشێری غەدر و خیانەتی گرت بە دەستەوە..

کات نیوە شەو بوو.. ئەو نۆ پیاوە وتیان: چاوەڕێ دەکەین تا وشترەکە بێتە دەرەوە بۆ ئاو خواردنەوە.. لەوێ دەتوانین بە ئاسانی بیکوژین..

قەیداری بەدبەخت بۆسەی بۆ وشترەکە نایەوە.. لە سەر ڕێگای وشترەکەدا لە شوێنێکدا خۆی حەشار دا.. کاتێ خۆر هەڵات، وشترەکە و بێچووەکەی هاتنە دەرەوە بۆ ئەوەی بڕۆن بۆ سەر کانییەکە و ئاو بخۆنەوە..

لەپڕ قەیداری بەدبەخت هێرشی بردە سەر وشترەکە و شمشێرێکی لە ملی دا.. وشترەکە کەوتە سەر زەوی.. تەماشای بێچووەکەی دەکرد و بە زمانی حاڵ پێی دەگوت: بێچووە بچکۆلانەکەم هەڵێ و خۆت بشارەوە!..

بێچووە وشترەکە بەرەو کێوەکە هەڵات.. بەڵام قەیداری بەدبەخت ڕایکرد بە شوێنیدا و ئەویشی گرت و بە ناشیرینترین شێوە سەری ئەویشی بڕی!..

حەزرەتی صالح(سڵاوی خوای لێبێت) و موسوڵمانان بەم تاوانەیان زانی.. تەنیا فریای ئەوە کەوتن کە خوێنی بە ناهەق ڕژاوی وشترەکان ببینن..

لە لای ئاسۆوە هەورێکی ڕەش پەیدا بوو.. ترس باڵی کێشابوو بەسەر هەموو شوێنێکدا.. هەرچی شتی جوانە خۆی حەشار دەدا و دیار نەدەما.. ئەو خەڵکە لە خوا یاخییە تاوانبارە حەزیان لە جوانی نەبوو.. وشترێکی بە پیت و فەڕیان کوشت.. ئەو وشترەی ئەوەندە شیری پێدەدان، کە بەشی هەموانی دەکرد.. جگە لە وشترەکە بێچووەکەشیان کوشتبوو..

حەزرەتی صالح(سڵاوی خوای لێبێت) بانگی کافرەکانی کرد و فەرمووی: ﴿تَمَتَّعُوا فِي دارِكُمْ ثَلاثَةَ أَيّام ذالِكَ وَعْدٌ غَيْرُ مَكْذُوب﴾ هود: ٦٥ واتە: لە ماڵ و مەنزڵی خۆتاندا بۆ ماوەی سێ ڕۆژ ڕابوێرن، (دوای ئەو ماوە دیاری کراوە تیادەچن) و ئەوەش پەیمانێکە و هەرگیز بەدرۆ ناخرێتەوە.

ئەو هۆزە لە خوا یاخییە ویستیان حەزرەتی صالح(سڵاوی خوای لێبێت)یش بکوژن.. بەڵام پێش ئەوەی ئەوان بەو کارە قێزەونە هەستن، نیشانەکانی تۆڵەی خودایی دەرکەوتن.. لە لای ئاسۆ هەورێکی ڕەشی زۆر ناشیرین دەرکەوت.. خۆر و مانگی شاردەوە.. تاقە ئەستێرەیەک دیار نەبوو.. هەموو ئاسمانی داپۆشی.. تاریکاییەکی زۆر سەیر دونیای تەنیبوو..

لە نیوەی شەودا هەورە بروسکە دەستیپێکرد.. هەور بە شێوەیەکی زۆر ترسناک دەیانگرماند.. دوایی بروسکەیەکی زۆر بەهێز هات و هۆزی سەمودی خاپوور کرد و هەموانی لە ناو برد.. گەلی ستەمکار لە دەنگی ئەو بروسکانە تۆقین.. دڵیان بوو بە دوو کەرتەوە..

هەورە بروسکە هەموو کۆشک و تەلارەکانی لەگەڵ زەویدا یەکسان کرد.. هەموو شیو و دۆڵەکان پڕ بوون لە ئاگر..

جگە لە حەزرەتی صالح(سڵاوی خوای لێبێت) و شوێنکەوتووانی نەبێ، ئیتر هیچ کەسێک ڕزگاری نەبوو..

بەو جۆرە هۆزی سەمود تیاچوون.. ڕۆژی چوارەم هەموو شتێک کۆتایی پێهاتبوو.. گەلێکی ستەمکار نەمابوو بە ناوی هۆزی سەمود..

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئاوا باسی لە ناوچوونی ئەو هۆزە دەکات: ﴿فَأَخَذَتْهُمُ الرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُوا فِي دارِهِمْ جاثِمينَ﴾ الأعراف: ٧٨ واتە: ئینجا یەکسەر (دوای سەربڕینی وشترەکە) بوومەلەرزەیەک و دەنگێکی سامناک گرتنی و پێچانیەوە و دوا بە دوای ئەو، هەموان لە ماڵەکانیاندا بەچۆکدا هاتن و هێزی ئەژنۆیان شکاو تیاچوون.

3

قورئانی پیرۆز، ئەو کتێبەی کە خوای گەورە ناردوویەتی بۆ پێغەمبەری ئیسلام(صلی الله علیه وسلم)، گرنگترین و ڕاستترین سەرچاوەی ژیان و بەسەرهاتی پێغەمبەرانە.. چونکە قورئان لە لایەن خوای گەورە و میهرەبانەوە دابەزیوە بۆ سەر پێغەمبەری ئیسلام(صلی الله علیه وسلم)..

بۆیە دەبێ ئێمەش قورئان بخوێنینەوە و لێی ڕامێنین و سوود لەو چیرۆکانە وەربگرین، بۆ ئەوەی ئیلهامی لێ وەربگرین و ڕێگای پڕشنگداری پێ بدۆزینەوە..

ئەو ڕێگایەی کە بەرەو ئاشتی و ئەوین و خۆشەویستیمان دەبات.. بەرەو ئەو بیروباوەڕەمان دەبات کە هەموو پێغەمبەرانی بۆ نێردراوە..

ئەم کۆمەڵە چیرۆکە لە قورئانی پیرۆز و تەفسیرە بەنێوبانگەکانی قورئان وەرگیراون.. بۆ ئەوەی گرنگی بە بیروباوەڕی منداڵانمان بدەین..

**ناوەندی ڕێنوێن**

07701932749 - 07501269689

hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com

سلێمانی - بازاڕی ئاوباریک - نهۆمی یەکەم
بەرامبەر کاسۆمۆڵ - دوکانی ژمارە (٦٦)


9789922626659